چیا


ناسنامەیٚ پرتووک

ناو: ئیکارۆس، ئەڵۆەکەیٚ بیٚتاشا

کوومە هەڵبەس کوردی

بڤەش: ڕێوار ئاودانان

وەشنگە: چیا

یەکم چاپ: ۲۷۲۵ کوردی / ۱۴۰۴ هەتاوی

---

مشخصات کتاب

عنوان: ایکاروس، آن عقاب بی‌باک

مجموعه شعر دوزبانەی کُردی ـ فارسی

شاعر: ریوار آبدانان

نشر: چیا

چاپ نخست: ۲۷۲۵ کُردی / ۱۴۰۴ خورشیدی

### ❖ نەڤیین دووس

ـ نەڤیین دووس منێ ڤە چە؟

ـ گوڵەفتاوێ دەناو کەڕەپیی خەس.

### ❖ غیابِ دوست

ـ غیابِ دوست به چه می‌مانَد؟

ـ گُل آفتابگردانی میانِ مِه غلیظ.

## ❖ پێشکەش ڤە ئەڤ کەسە ک ئەژ زۆن داڵکیی خوەیێ ڤای!

ئاخ دۆنکیشۆت!

سووارخاس ڕاسەکییش ئەگەر بوویی

ئەڵ کووڵ ئی ئەسپ چوویینە

بڕ شوونێک نەیکەری.

نەچووا!

نەژنەفتینە هەر کەسێ ئەژ خوەیێ بووایێ

دووە ئەڤ بایێ هەمیشە ئەڕاگێڵە

ک چارەنقیسە گەنەکەیێ

گومەڤ بیین دەناو پێچەڵپێچ لاڕێیەلە؟!

## ❖ تقدیم به آن کسی که از زبان مادریِ خود گریزان شد!

آه دُن‌کیشوت!

شهسوارِ واقعی هم اگر باشی

بر پشتِ این اسبِ چوبین

به جایی نمی‌رسی.

نرو!

نشنیده‌ای هر کسی از خودش بگریزد

آن بادِ همیشه آواره می‌شود

که سرنوشت شومِ او

گم‌شدن در هزارتویِ بیراهه‌هاست؟!

## ❖ دە وڵاَم شارانگەردێ ک ناو و نیشان وڵاتەکەم پرسی

خوەرهڵات ناوڕاس

شوونەزایێ خوداژنەیل دڵنەرم چیا و

خودایل گرژ و توورەیێ چووڵگەس؛

شوونەزایێ فریشتەیل باڵشکیایێ و

"پرۆمتە"یلێگە ک

پەڕە وە پەڕەیێ پرتووک چارەنۆسێیان

خاچ و ئەشکەنجە و شاروەدەرییە.

خوەرهڵات ناوڕاس

مەڵوەن هزارەیل دۆرتر زەردەخەنە و هەڵپەڕکە و ئاواز

ئوو هزارەیل نزیکتر ئرمس و پەژارە و ئاهـ

مەڵوەن نەفت و ئاگر و گڕەتینگی

ئوو گوڵە مزگانییەیل

ک لە وهاران بێوارانیش

ژە خۆن ئێمە ڕووڵەیلێ

سەر ئەڵارن.

ئێمە فرەێمن و

ناو گردمان "ئینانا" و "ئیشتار" و "ئافرۆدیت"ـە

ئێمە فرەێمن و

ناو گشتمان "دومووزی" و "تەمووز" و "ئادۆنیس"ـە

وەێرە ک وراز جەنگ

هەمیشە هەڕەشە و گوڕەشە ئەڵ ئەوین کەیٚ و

ڕەنگینییەگان باخ کوشیٚ!

وەێرە ک "ئازادی"

دار ژیانە و

دجارە لە خوڵەکووان دڵەیلمان چۆزە دەیٚ و

پەل کیشیٚ!

## ❖ در پاسخِ جهانگردی که نام و نشان سرزمین‌ام را پرسید

خاورمیانه

زادبومِ ایزدبانوانِ مهربانِ کوهستان و

خدایانِ خشمگینِ بیابان است؛

زادبومِ فرشتگانِ شکسته‌بال و

«پرومته»هایی‌ست که

برگ به برگِ کتاب سرنوشت‌شان

صلیب و شکنجه و تبعید است.

خاورمیانه

سرزمینِ هزاره‌های دورترِ لبخند و پایکوبی و آواز

و هزاره‌های نزدیک‌ترِ اشک و اندوه و آه

سرزمینِ نفت و آتش و عطش

و شقایق‌های نُعمانی

که در بهارانِ بی‌باران نیز

از خونِ ما فرزندانش

سر برمی‌آورند.

ما بسیاریم و

نام همگی‌مان «اینانا» و «ایشتار» و «آفرودیت» است

ما بسیاریم و

نام همگی‌مان «دُموزی» و «تموز» و «آدونیس» است

اینجا که گُرازِ جنگ

همواره عشق را تهدید می‌کند و

زیبایی‌های باغ را می‌کُشد!

اینجا که «آزادی»

درختِ زندگی‌ست

و دوباره از خاکسترِ دانِ قلب‌هایمان جوانه می‌زند و

شاخ‌وبرگ می‌گستراند.

## ❖ کێیم؟

کوتێ ژە م، چیایێ سەهۆڵە

سەردسڕ و

کوتێ تر، خوەرەتاوێگ

ک دۆکوت شەوارانیش

ئاوا نیەودا!

## ❖ کیستم؟

نیمی از من، کوهِ یخ است

سردِ سرد و

نیمِ دیگر، آفتابی

که نیمه‌شب‌ها نیز

فرو نمی‌نشیند!

## ❖ پەژارەیٚ ئازادی

لەیٚرە

دە نیشتمانەگەم کوردستان

ئەڵ سەر و پرچ دارەل و

بیٚدەنگیی دیوارەل

ئەڵ ئامازەیٚ دیار پێڵەل و

شەو قیرتاو ڕێیەل

ئەڵ ناوچاوان بەرز چیا و

بیٚگەردیی گڵاڵەل

ئەڵ کراس وەفر و

لەش وا

ئەڵ پەڕەیل ئاگر و

دیرووک خاک

خوٚن ئەڵپشیاگە؛

لەیٚرە

دە نیشتمانەگەم کوردستان

سیٚهزار ساڵە ک

ئازادی

وە بێ‌ھچان

ئەڕا گیانەیل زامدارمان

ئاھـ ئەڵکێشیاگە!

## ❖ اندوهِ آزادی

اینجا

در میهنم کُردستان

بر شاخ و برگِ درختان و

سکوتِ دیوارها

بر اشارەی آشکارِ پُل‌ها و

شبِ آسفالتِ جادّەها

بر پیشانیِ بلندِ کوهستان و

پاکیِ رودخانەها

بر پیراهنِ برف و

پیکرِ باد

بر صفحاتِ آتش و

تاریخِ خاک

خون پاشیده است؛

اینجا

در میهنم کُردستان

سه‌هزار سال است که

آزادی

بی‌وقفه

برای جان‌های زخمیِ ما

آه کشیده است!

## ❖ ئیسفا

م ئەژ ئیسفاگرتن بەرد،

کۆ گلئاوردم

ئەژ ئیسفاگرتن بەڵگ،

دارسۆن.

م ئەژ ئیسفاگرتن ئەۆر،

ڤارۆن گلئاوردم

ئەژ ئیسفاگرتن ئاسمۆن،

ئاسارە.

ئەژ ئیسفاگرتن تۆ ئەمانێ

هەرگز گلناوردم؛

ڤە ڤێنەێ سێپریسک کووچەرێ

ک دە بێیازیی دەشتەل گەرمەسێر

گرد ڕێیەلەێ گلئاوردن

ئەژ ڤیر بردۆیی!

## ❖ تماشا

من از تماشای سنگ،

کوه برگشتم

از تماشای برگ،

جنگل.

من از تماشای ابر،

باران برگشتم

از تماشای آسمان،

ستاره.

از تماشای تو اما

هرگز برنگشتم؛

همچون پرستوی مهاجری

که در وسعتِ دشت‌های گرمسیری

همه‌ی راه‌های بازگشت را

از یاد بُرده باشد!

### ❖ بێسەر و شوونی

چراخ دەنگت ها کوو؟

یە چەنێگە وەناو تیەریکیی جەهان

ناوەگەم، گومم کردگە!

### ❖ بی‌نشانی

چراغِ صدایت کو؟

چندی‌ست در تاریکیِ جهان

نامم، مرا گم کرده است!

## ❖ مەڵهەم

من و تۆ

چڵەیل دار لیمووێگیمن

ک لە ڕووشنایێ مانگەشەو

خەوزڕ بۆمنە!

وەو دووکەڕسە

ک دە بان سەرپەنجەگان سەوزت نیشتگە، بۆش

ئەڕا گوڵوەچێ بچریکنێ

ک ئەڵ بان شان بریندار و شەکەت م گوشکیایە.

## ❖ مرهم

من و تو

شاخه‌های یک درخت لیمو هستیم

که در روشناییِ مهتاب

آشفته‌خواب گشته‌ایم!

به آن چرخ‌ریسَک

که روی سرانگشتانِ سبزت نشسته است، بگو

برای گُل‌غنچه‌ای نغمه سر دهد

که بر شانه‌ی مجروحِ و خسته‌ی من شکُفته است.

## ❖ بەرفێ ک دیر ئەژ ساگەت، تاوێ

بەیانی زی

ڤەرەژ پەنجرەلەێ ماڵەکە

ئەڵسیامە.

ئێنکە ها ڤە چرچ لەرز و ناوکوتە

ئیسفایێ ناو ئایێنە دگرم:

دەی هەنسایێ گورگ مێشە

چەنێ کەمترەڤ بیمە!

هەێ چی دڤنە و

پیێرنە و

پەسپیێرنە

ئەڵڕوویامە!

"نەڤیینت"، لەتێ ترەک ئەژ بیینم

لەفەڤ دایێە.

## ❖ برفی که دور از سایه‌ات، آب می‌شود

صبحِ زود

پیش از پنجره‌های خانه

بیدار شده‌ام.

اکنون با تشویش و ترس و لرز

درونِ آینه را برانداز می‌کنم:

در این لحظه‌ی گرگ‌ومیش

چقدر کمتر شده‌ام!

درست مثلِ دیروز و

پریروز و

پس‌پریروز

به یغما رفته‌ام!

«نبودن‌ات»، پاره‌ی دیگری از هستی‌ام را

بلعیده است.

## ❖ خەون زامدار

لە ڕۆ زەمین

لەسەر مانگ

لەناو گەلەئاسارەێ ڕێگاێ شیری

لە گەردوون و

جەهانەیل نەناسریاێ ترەکیش

هۆچ چشتێگ، مەترسیدارتر ئەژ

"خەون زامدارێگ ک ژە پشتەو چەقوو دریاسە لێ"

نییە.

دماێ ئەڤە:

گولە

تەشبریق

ڤەزەن

لافاو

هەرەسبردن

ڤە گژ یەێ شێت بۆگدەڤەدەس چیین

شێرپەنجە

زەمیڕکە

ئاگرەپەخشان

خنکیان

تژنەی دە هەردە و هەڵەتەیل

تەشەنەیْ ناخوەشیی مەژناسێگ

دەوا و دەرمان هەڵە

دڵەکوتە و هووڵ فرەوان

وسیان دڵ

ئوو پێڕست بیْبنیْ ژە هامکارەیل مەرگ تیْ

ک هەرسەیْ ئڕا گڵەنگبیین همێد و

لە یەک چۆچیان جەهان لەشەیل لەڕ و کزمان بەسن

جارجاریْ وە تووزکاڵێگ ڕەژەن و بەختخاسی

لە وەرانوەرمان شکەس خوەن.

ئەمانیْ ئەو "خەون زامدارە"

هەردەم

تەنانەت وەرجە ئەوە ک فریشتەیْ مەرگ، ئازڵدە باێد

کارەگەیْ خوەیْ

سەرکەفتێیانە ڤە بندرس بردێیە

هەر وە ئەو چەقوو خۆناویی چکیاێە دەناو مازەیْ!

## ❖ رؤیای زخمی

روی زمین

بر روی ماه

درون کهکشانِ راه شیری

در کیهان و

جهان‌های ناشناخته‌ی دیگر نیز

هیچ چیزی، خطرناک‌تر از

«یک رؤیای زخمی که از پشت چاقو خورده است»

نیست.

پس از آن:

گلوله

صاعقه

پرتگاه

سیل

ریزشِ بهمن

با یک دیوانه‌ی دشنه‌به‌دست گلاویزشدن

سرطان

زلزله

آتشفشان

خفگی در آب

تشنگی در صحرا و میان تپه‌ماهورهای خشکیده

سرایت یک بیماری ناشناخته

داروی اشتباهی

دلشوره و اضطراب بسیار

ایست قلبی

و فهرستِ بی‌پایانی از همکارانِ مرگ می‌آید

که هرچند برای نابودیِ امید و

ازهم‌پاشیدنِ دنیایِ پیکرهای نحیف‌مان کافی‌اند

گهگاهی با اندکی شانس و خوش‌اقبالی

در برابرمان شکست می‌خورند.

اما آن «رؤیای زخمی»

همیشه

حتی پیش از آنکه فرشته‌ی مرگ، سر برسد

کار خود را

پیروزمندانه به پایان بُرده است

با همان چاقوی خون‌آلودِ فرورفته در گُرده‌اش!

## ❖ سەرگە

ـ سەرچەۋەیۑ ئی گڵاڵ خین بیۑبنە ها کوو؟

ـ درڕک چکیاێە دە پایۑ ئاوەختێک.

## ❖ خاستگاه

ـ سرچشمەی این رودِ خونِ بی‌انتها کجاست؟

ـ خارِ خلیده به پایِ آرزویی.

## ❖ بندرس

سەرئەنجام

مەرگ، پاشخوانەگەیٚ دورس ئەڵوٚژنیٚ

ئوو ئیمە

وە پرسیار ڕەسیمن؛

پرسیارێگ لەبە کەڵێن

ک دی لەناو ئیٚ جەهانە

نیەگونجیمن.

## ❖ نهایت

عاقبت

مرگ، پاسخِ درست را انتخاب می‌کند

و ما

به پرسش می‌رسیم؛

پرسشی چنان بزرگ

که دیگر در این جهان

نمی‌گنجیم.

## ❖ بەرزەفڕی

ئیکارۆس!

ئەیٚ ئەلٚۆەکەیٚ زەڕین بیٚتاشا!

نەکەریٚ ئەژ خەون باڵگرتن

دەس بشووری؛

ک چمەیٚتئاسا کەفتن

دەناو دەلیایٚ تەریکی و

بیٚنوون و بیٚگڵکوو مەننیش

تۆنیٚ فرە شکوومەن بوو؛

هەیٚک دە ئی سەردەم سەرد و سڕە

ڤەسنگەیٚ ماچکردن چەۆ ئەفتاو

ئەژ چکەڵیی "ببین خوەت"

ئەۆ بۆنتر چۆیین و

باڵەلت

دە بیٚبنیی ئاسمۆن

ڤەر گڕیٚ

ئەژ یەک ئەۆکریاوین

ڤە بیٚ هۆچ زەنجیر و بەنیٚ...

## ❖ بلندپروازی

ایکاروس!

ای عقاب طلاییِ بی‌باک!

مبادا از رؤیای پرواز

دست بشویی؛

که مشعل‌وار فروافتادن

به درونِ دریای تاریکی و

بی‌نشان و بی‌مزار ماندن نیز

بسی باشکوه می‌تواند باشد؛

آنگاه که در این دورانِ سرد و بی‌روح

به عشقِ بوسیدنِ چشمِ آفتاب

از ستیغِ «هستیِ خویش»

فراتر رفته باشی

و بال‌هایت

در بی‌انتهاییِ آسمان

برای لحظه‌ای چند

از هم گشوده گشته باشند

بی هیچ زنجیر و بندی...

## ❖ کەۆگ زەمدار

نە!

ئی شاقەشاقە ک نەێژنەۆینەیٚ

بیٚدەنگی نییە

قولاو گیرکردەێکە

دەناو گەلی؛

پرسنشۆنەیٚ

ئەڵ ڤەراوەر تفەنگ

## ❖ کبکِ زخمی

نه!

این نغمه‌ای که نمی‌شنوی‌اش

سکوت نیست

قلّاب گیرکرده‌ای‌ست

در گلو؛

علامتِ پرسشی

در مقابلِ تفنگ

## ❖ قوورەێ مەرگ

دەسەیلت نادیار

چەوەیلت نادیار

زەردەخەنەت نادیار

ئوو یە، چنەو بێپاراستن و ئازبرم کەێ

ک کەڵەگاێ "پەژارە"

وە بیچگترین لرەێ ویرمانەیل

شاخەیل تێژ خوەێ

دە ناخ دڵم

چقنێ.

دەسەیلت نادیار

چەوەیلت نادیار

زەردەخەنەت نادیار

ئوو ئەوەێگ

لە مەوداێگ نزیکتر ژە من وە من

قوورنێ

مەرگە.

## ❖ ماغِ مرگ

دست‌هایت ناپیدا

چشم‌هایت ناپیدا

لبخندت ناپیدا

و این، چنان بی‌دفاع و ناتوانم می‌گردانَد

که نرّه‌گاوِ «غم»

با کوچک‌ترین تکانِ خاطرات

شاخ‌های تیزِ خود را

در ژرفنای قلبم

فرو می‌بَرَد.

دست‌هایت ناپیدا

چشم‌هایت ناپیدا

لبخندت ناپیدا

و آن‌که

در فاصله‌ای نزدیک‌تر از من به من

ماغ می‌کشد

مرگ است.

### ❖ پاوەمووری

واران

لووبڕ و وەڵەکەت وەت:

داربەڕۆەیل زاگرۆس، ژنن

ژیان وەخشن و

لەناو بڵازەیل نامێرەوانییا سزن!

### ❖ سوگ‌آواز

خسته و کوفته

باران گفت:

بلوط‌های زاگرس، زن‌اند

زندگی می‌بخشند و

میانِ شعله‌های نامهربانی می‌سوزند!

## ❖ دەمتەقە ئەگەرد نەچیرڤان

ژۆنەلم

ماڵی نێیەون؛

ئەژ "ستارگرتن دەناو قەفەس"

ڤەرم نەڤەش ــ

بپووقن!

## ❖ گفتگو با صیّاد

دردهایم

اهلی نمی‌شوند؛

از «آرمیدن در قفس»

با من مگو ــ

شلیک کُن!

## ❖ پەڵپ

ـ ئمڕووژ چەن شەمەس؟

ـ وە بێ ئەۊ

ناو ڕووژەیل هەفتە گشت، "دڵتەنگی"ـیە!

## ❖ بهانه‌گیری

ـ چند شنبه است امروز؟

ـ بدون او

نامِ همه‌ی روزهای هفته، «دلتنگی»ست!

## ❖ زاڕوو زاگرۆس

بنچینەت، ژە داربەلییەلەیٚ زاگرۆسە!

ئیٚ ڕازە

تەنیا م زۆنمەیٚ

ک تا بن نادیار تەڵەنەل تەنیاییم

ڕەگ و ڕیشە شەنینە و

مریژەل و شیٚرکەدارەلیٚ ک

هەر ساڵ، زاد و تووشەیٚ زمسۆنیی خوەیٚیۆن

ئەژ ناوتوو چرچلووچەل کراسە سەقز و دڕەکەیٚ تاوسۆنییت

ڤە چنگ خسنە.

بنچینەت، ژە گڵاڵەیلەیٚ سەرکەش زاگرۆسە!

ئیٚ ڕازە

تەنیا خرکەبەردەلیٚ زۆننەیٚ

ک ئەژ بەرزیی کەش‌کۆ بیٚدەنگی

ڤیر هماریەل بێیاز دەمتەقە بردینەسۆن

ئۆ م، تەنیا ماسیی ئازادیٚ ک

دە ناوگەر کرەیل دەسەلت

ڕێی هەوگل‌کردن ڤەر جامالگەم، گوم کردمە.

## ❖ فرزندِ زاگرس

تبارت، به درختانِ بلوطِ زاگرس می‌رسد!

این راز را

تنها من می‌دانم

که تا اعماقِ ناپیدایِ صخره‌های تنهایی‌ام

ریشه دوانده‌ای

و مورچه‌ها و سنجاب‌هایی که

هر سال، آذوقه‌ی زمستانیِ خودشان را

از لابه‌لای چین‌های پیراهنِ سبز و بلندِ تابستانی‌ات

به چنگ آورده‌اند.

تبارت، به رودخانه‌های سرکشِ زاگرس می‌رسد!

این راز را

تنها قلوه‌سنگ‌هایی می‌دانند

که آن‌ها را از بلندای کوهستانِ سکوت

به دشت‌های گسترده‌ی گفتگو بُرده‌ای

و من، تنها ماهیِ آزادی که

لابه‌لای خطوطِ دست‌هایت

راه بازگشت به خانه‌ام را گم کرده‌ام.

## ❖ خوتووره

بۆچگه ڕووشێگم

ژه دڕگ بنجگه سووره‌گوڵێگ

ئه‌ڵ قه‌یٚ بله‌مرک ئیٚ جه‌هانه ـــ

چ ئاسان له ویره‌و دچم!

## ❖ دغدغه

خراشی کوچکم

از خارِ بوته‌ی گُل سرخی

بر آرنجِ این جهان ـــ

چه آسان از یاد می‌روم!

❖ تـ ...

تەنیایی قیل ــ

دەس دسام ئەڵ قەیٚ هەرچی

تونی

❖ تـ...

تنهاییِ ژرف ــ

بر هرچه دست می‌کشم

تویی

## ❖ شیرین عەلەم هولی، دۆەتە سەرهەڵدێرەگەیٚ چیا

یە منم، شیرین

دۆەتە سەرهەڵدێرەگەیٚ چیا

لەورا ک لە قورِن وێشەیل چرِ و پرِیٚ

پەڵنگەیل جەوان تۆرِەیی

لە دەورگرد گوڵەمە دڵرِفنەگەیٚ مانگەشەو

نەرامدار و زاڵ و سەرکەفتێیانە نەرِنن.

ئوو ئێوە ئەی زندانوانەیل پیر و داماو "ئڤین"!

ـ ک چووڵیی لێڵ چرچێگ

لەناو نوورِین سەردوسرِتان دەم داچەقانێیە ـ

میلە و دیوار و بەندتان

فەن و فێڵ بیٚوەلیفەتێگە.

پەڵنگەیل جەوان وێشەیل چەوم

هەرگز وەتان رِام و ملکەچ نیەون.

ئەهاو ئەشکەنجەدەرەیل نک ناهمیٚ و ڤڵەکەت "ئڤین"!

م ژە لانەمایٚ دارستانەیل سەوزبییە لە هناز وام

ئوو لە ژێر تەوەرگ شمرِەیلەتان

تەنیا پرتەیٚ ورووژێنەر سەرئەڵدانە

ک دەناو لەش بریندارم گورجانەترەو دبیٚ.

ڤەرچە گەرەک ئەژ بەرفە قورسەگەیٚ پیٚشهات بترسم؟!

هەیٚک بتەۆترین سەنگەر

دڵنیا ببین ئەژ حەقیقەت ئەو ڕاگەسا ک چیمە.

ئەڕاچە لە زەلان سەرد تیەریکی بایٚس بترسم؟!

هەنایٚ لە بان چوارپایٚەگەیٚ سیٚدارەیش

بەژنرێکی و باڵابەرزی، مزگانایٚگە

ئەڕا کلگەیل پڕتاسە و ئاوەختخوازم

ک ماچەیل خوەرەتاو

فەرە نزیکن.

یە منم، شیرین

دۆەتە سەرهەڵدیٚرەگەیٚ چیا

چەوەیلم، بەڕۆەگان ناسیار زاگرۆسن

ک ڕیشە لەناو زڵاڵیی وەفراو سەرکاوان دیٚرن

دەسەیلم، لیٚوارەگان سەوز و بیٚیاز ڕووبار ئاراسن

دڵم، چیایٚ ئاگرییە و

خۆن گەرم فرات دەناو وەنەوشەزارەگان ڕەگەیلم لە جمیانە.

ئەهاو گاوشەنەرەیل وە هۆچ جی ـ نەڕەسیی "ئڤین"

ک ژە لانەمایٚ پایٚەبەرز و دیاریی چڵکاوخوەرەیل "دەربار"ـین!

ئوو بیٚدەنگییم لە وەراوەر چەپاڵەیٚ هەر پرسیار

برنگ‌دان کوچگێگه

دەناو مرداوەگەیٚ بیٚ‌پەیٚ و وەڕەزکەر ناهمێدیتان

هماوری ئەودمایٚ کووشین گیانتەزن فرەێگ

چەن پیاڵە خۆن و

گومەیلیٚ سقان شکیایٚ لەشم

بووە بەش ئێوە سەربڕەیل هنجەهنجەکەر

ئەمانگ وەگەرد بیٚ‌دۆایی خومین ئەروایٚ سەرکەشم چە کەین؟!

مەگەر بوود وە کەشتییەیل گەورایٚ سەرکەفتن

ک لە سروەیٚ ئاواخت م، بایەوان ئەوکردنە

تا وەرەو گشت بەندەرەگان چەوەڕێی جەهان سەفەر بکەن

فەرمان وسیان و بیٚ‌جۆلە بیین بدەی!

مەگەر پووڕیٚ گەورایی و فەڕ زاگرۆس و

سەردەنەیل [بەرزبییە] تا بڵنگای ئەور

کووت و بەند بکەی!

مەگەر دوویٚ کەلەپچە ئەڵ [دەسەیل ڕووبار] ئاراس بدەی و

بووەیدەیٚ ئەڕا ژوور تاکەکەسی!

مەگەر پووڕیٚ چیایٚ ئاگری ملکەچ و سەرسپاردێیەو بکەی!

مەگەر بوودن چەمەگەیٚ فرات وە باڵبەستەی

لە وەراوەر جووخەیل مەرگ

بەیدە وەر دەسڕێژ گولە!

یە منم، شیرین

دۆەتە سەرهەڵدێرەگەیٚ چیا

ئوو ئێوە ئەی دادوەرەیل پلەبەرزا!

ک بەن ترازییەگەیٚ دادپەروەری

ژە گێسەیل بڕیایٚ دالگ نیشتمانم چنینە

گیرام ک لە ماوەیٚ فرە کوڵ چەن گڕ

بڕیار مردن م دەربکەین

بڵەم وەگەرد ئەسپە تۆسنەگەیٚ تیژپا و بیٚستار خەونەلم

چە کەین؟!

ک وە یاڵەیل پەخشانیٚ

ئەو نووایٚ گش کات و زەمانەیل، نەرمە خارێیە.

وەگەرد بەژن و باڵای کەورئاسایٚ باوەڕم چە کەین؟!

ک بەرزترین دارەیل سێدارەتانیش

لە وەراوەریٚ فریە نزمن.

م، گوڵووک سۆەر بەرهەڵستییم و

گورمێچەیٚ ئاگر.

تۆش سیسی و گەڵاڕێزان نیەوم

وە دەم واێەو، ژە کیس نیەچم

دانامرکم

تا ئیٚ دڕکستان کۆەنەساڵ ستەم و بێدادە

بچەڵکەن و بنبڕ بکەم.

یە منم، شیرین

دۆەتە سەرهەڵدێرەگەێ چیا

ئوو بەردەوامم لە خەبات و شەڕ

ئەڕا ڕزگاربیین ژە پیلە ڕەشەگەێ چارەنقیس

تا هەڵفڕین، بکەم وە سارێژ باڵەیل شکیاێ ژن خوەرهەڵاتی

من ک ڕزگاری ژە واێ

ساکاری ژە ئاو

گەشی و تازەی ژە پۆنگەیل کۆەی

ئوو بەخشێنەری ژە خوەر چاشیامە.

یە منم، شیرین

دۆەتە سەرهەڵدێرەگەێ چیا و

بەردەوامیی بێپەرتخ درەوشیان و زەقینە

ئوو یە، حەقیقەتە ک لە وەرئەیوانەگەێ دڵم

تەمۆرەێ بێهچان ئەڤین ژەنێدن.

بێهوودە م ئەڕا ئەونیشتن ژە هەڵپەڕگە قەقنەسییەگەم نەچڕن

چۆن ک کەس نیەتۆەنێ ئاگر هەڵاتن

لەناو سەنگەر گیان مەردمان بوێر و سەرئازا

بنکەفتەێ قڵ و خوڵەکوو شەوگار بکەێ.

م ئێرنگە

نە کانیلەیٚ شیرینێگ

بەڵکوو زەریاێگم

تا ماسی سییە بۆچکەڵەگان

وەرەو شازەریایٚ مەزن ڕووناهی ڕێنمای بکەم.

ئوو ئێوە ئەی فەرمانبەرەیل لەرزووک ئەوڕێبەر بڕیار سێدارە

بێهوودە، ڕیٚ وەرەو پەرتخ نیشانم نەیەن

م ناونازار پرچ و پاکیٚ ژە لانەمایٚ قەتارقولْنگەیل کووچەرم

هەر ئاسمان، سەفەر

ئەڕا م دەسپێک خەسپەن و ئەرکێگە

دچم تا وەگەرد وەهاران گل بێیارم

... ئوو وەگەرد وەهاران گلەو دێیارم.

## ❖ شیرین علم هولی، دخترِ عصیانگرِ کوهستان

این منام، شیرین

دخترِ عصیانگرِ کوهستان

آنجا که در عمقِ بیشه‌های انبوهش

پلنگ‌های جوانِ خشم

گردِ برکه‌ی دلفریبِ مهتاب

پُرغرور و فاتحانه می‌غُرّند.

و شما ای زندانبانانِ پیر و درمانده‌ی «اِوین»!

ـ که خالیِ گُنگِ وحشتی

در نگاهِ سردتان دهان گشوده است ـ

میله و حصار و بندتان

ترفندی بیهوده است.

پلنگ‌های جوانِ بیشه‌های چشمِ من

هرگز رام‌تان نمی‌شوند.

های شکنجه‌گران ناامید و خسته‌ی «اِوین»!

من از تبار جنگل‌های رُسته در مسیرِ بادم

و در تگرگ تازیانه‌هایتان

تنها نبضِ شورانگیزِ عصیان است

که در تنِ زخم‌خورده‌ام تندتر می‌تازد.

چرا باید از برفِ سنگینِ حادثه ترسید؟!

آنگاه که محکم‌ترین سنگر

یقین به حقیقتِ راهی‌ست که رفته‌ام.

چرا از تندبادِ سردِ تاریکی باید هراسید؟!

آنگاه که بر فراز چارپایه‌ی اعدام نیز

راست‌قامتی، بشارتی‌ست

انگشتانِ پُر اشتیاقم را

که بوسه‌های آفتاب

بسی نزدیک است.

این منم، شیرین

دخترِ عصیانگرِ کوهستان

چشم‌هایم، بلوط‌های آشنای زاگرس‌اند

که ریشه در زلالِ برفابه‌ی قلّه‌ها دارند

دست‌هایم، سواحل سبز و فراخِ رودخانه‌ی اَرَس‌اند

قلبم، کوه آرارات است

و خونِ گرمِ فرات در بنفشه‌زارانِ رگانم جاری‌ست.

های بازجویانِ به‌ناکجارسیده‌ی «اِوین»

که از نسلِ شخیصِ کاسه‌لیسانِ درباریدا

و سکوتم در برابر سیلیِ هر پرسش

پرتاب سنگی‌ست

به مردابِ ژرف و کسالت‌بارِ یأس‌تان

گیرم که از پسِ تلاشِ جان‌فرسا

چند پیاله خون و

مشتی استخوانِ شکسته‌ی تنم

نصیبِ شما سلّاخان شود

اما با بیکرانِ نیلگونِ روحِ سرکشم چه می‌کنید؟!

می‌توان مگر به کشتی‌های بزرگِ پیروزی

که بادبان در نسیم شوقِ من گشوده‌اند

تا به همه‌ی بندرهای چشم در راهِ جهان سفر کنند

فرمانِ توقّف داد!

می‌توان مگر شکوهِ زاگرس و

قلّه‌های تا بلندِ ابر را

به بند و غُل کشید!

می‌توان مگر اَرَس را دستبند زد

و به سلّولِ انفرادی بُرد!

آرارات را می‌توان مگر سرسُپرده ساخت!

می‌توان مگر فرات را کت‌بسته

در برابر جوخه‌های مرگ

به رگبارِ گلوله بست!

این مرام، شیرین

دخترِ عصیانگرِ کوهستان

و شما ای عالیجنابانِ قضات!

که بند ترازوی عدالت را

از گیسوان بریده‌ی مامِ میهنم بافته‌اید

گیرم که حکمِ مرگ مرا

در فاصله‌ی کوتاهِ ثانیه‌ای چند صادر کنید

اما با توسنِ بادپا و بی‌قرارِ رؤیاهایم

چه می‌کنید؟!

که یال‌افشان

پیشاپیشِ همه‌ی زمان‌ها می‌تازد.

با قامتِ صخره‌آسای ایمانم چه می‌کنید؟!

که بلندترین چوبه‌های دارتان نیز

در برابرِ آن بسی کوتاهند.

من، شکوفه‌ی سرخِ اعتراضم

مشتِ گره‌کرده‌ی آتش.

خزان نخواهم دید

بر باد نخواهم رفت

خاموش نخواهم شد

تا این خارستانِ کهن‌سالِ بی‌داد را

ز ریشه برکنم.

این مرام، شیرین
دخترِ عصیانگرِ کوهستان
و در نبردِ همچنان
برای رَستن از پیله‌ی سیاهِ تقدیر
تا پرواز را مرهمِ بال‌های شکسته‌ی زنِ شرقی کنم
من که رهایی را از باد
سادگی را از آب
طراوت را از پونه‌های وحشی
و بخشندگی را از آفتاب آموخته‌ام.
این مرام، شیرین
دخترِ عصیانگرِ کوهستان و
امتدادِ بی‌انتهایِ اِشراق
و این، حقیقت است که در ایوانِ قلبم
تنبورِ پیوسته‌ی عشق می‌نوازد.
بیهوده مرا به فرونشستن از رقصِ ققنوسی‌ام نخوانید
چرا که آتشِ طلوع را
در سنگرِ جانِ مردمانِ دلیر و آزاده
نمی‌توان مغلوبِ خاکسترِ شب نمود.
من اینک
نه چشمه‌ی شیرینِ کوچکی

بلکه دریایم

تا ماهیانِ سیاهِ کوچک را

به اقیانوس بزرگِ روشنایی رهنمون گردم.

و شما ای مأمورانِ لرزانِ اجرایِ حکم

بیهوده، راه به انتها نشانم ندهید

من قدّیسه‌ای از تبار دُرناهای مهاجرم

هر آسمانْ سفر،

برای من آغازِ رسالتی‌ست

می‌روم تا با بهاران بازگردم

... و با بهاران بازخواهم گشت.

## ❖ سروود شەهید زیلان و سەما

ژنێگ ئاواز خوەنێ

وە هەزاران گوڵووک سێف

لەناو قورگێ

ئوو خوەرگەلێ ک ژە زڵفانێ

نەرمەنەرم تیەنەو بان

تا لە گشت ئاسووەیل، هەڵان.

خوداژنێگ ک دەسەیلێ

ڕێگەێ وێیەردن گشت چەمەیل جەهانە و

نگاێ

ڕێژنگەێ پەپوولەیل و ئاینە

ئەڵ زامەیل خاک.

ئاگر ـ ئاوازێگ لەناو باخ و

سروەێ ک تا وە هەێ

بوو ژنانەێ سێف دەێد!

## ❖ سرودِ شهید زیلان و سما

زنی آواز می‌خواند

با هزاران شکوفه‌ی سیب

در گلویش

و خورشیدهایی که از گیسوانش

نرم‌نرمَک بَرمی‌شوند

تا در همه‌ی افق‌ها، طلوع کنند.

الهه‌ای که دستانش

مسیرِ عبورِ تمامیِ رودخانه‌هایِ جهان است و

نگاهش

آبشارِ پروانه‌ها و آیینه

بر زخم‌هایِ خاک.

آتش_ آوازی به باغ اندر و

نسیمی که تا همیشه

بویِ زنانه‌ی سیب می‌دهد!

## ❖ هەڵبەستی بەیت

گەڵاڵ مەرگ

گەردی ئەڤ نقام.

ئیسفایێ ڕوخسار خوەم

دەناو گلارەلێ گرتم:

بێجەژ «نەڤیینت»

شێڤەیێ کەس نەیێدام!

## ❖ وقتی که نبودی

رودِ مرگ

پیچید و راهِ پیشِ رویم بست.

چهره‌ی خود را

در مردمک‌های چشمانش تماشا کردم:

جز «غیابِ تو»

به هیچ کس نمی‌مانستم!

## ❖ دڵنۆسەیل دڵووپ

هەر دڵووپێ، وشەێگە

هەر وشە، دەسپێکێ

ئەگەرچە مرۆڤ، دڵووپێگ تەنیاس

دۊاهمین دەمساڵ دڵنۆسەیل دڵووپ، دەریاس!

## ❖ دلنوشته‌های قطره

هر قطره، کلمه‌ای‌ست

هر کلمه، آغازی

انسان، اگرچه قطره‌ای تنهاست

آخرین فصلِ دلنوشته‌های قطره، دریاست!

## ❖ دۊایِ واران

دۊایِ واران

گشت چشتیِ ساناترەو دووگ؛

تەنانەت واتایِ ئاسمان

لە چەو چاڵاوێگ بۆچگ.

## ❖ پس از باران

پس از باران

همه چیز آسان‌تر می‌شود؛

حتی معنایِ آسمان

در نگاهِ چاهِ آبی کوچک.

### ❖ شەوە

ساڵ مەڵ بێدەنگی و

کووچ باڵنەیل گوورانی و نارینە

"قاڕ... قاڕ... قاڕ"

ئۆ بێدەنگییەکە سێتر دکەرێ

ئی قڵاێ ناو مەتەڵەیل داپیرە

ک ئەژ گڵارێژان باخ منالی مەنێیە جا و

ئاوەختەیل ڤەدەم ڤا چییەمان دقاڕنێ.

### ❖ کابوس

قحطسالِ سکوت و

کوچِ پرندەهایِ ترانە و آواز

«قار... قار... قار»

و سکوت را سیاەتر می‌کند

این کلاغِ قصّەهایِ مادربزرگ

کە از برگریزِ باغِ کودکی جا ماندە و

حسرت‌هایِ بر باد رفتەمان را می‌قارَد.

## ❖ هەڵگەردیان

وە پێچەوانە گیرە بکە!

بیلا ئەڕا یەێجاریش ک بۆە

واران، هەڵگەردێدەو وە ئاسمان

ئەور، وە دەریا

دەریایٚ پڕشەپووڵ و شێواو، وە ستار

ستار، وە دڵەگەیٚ من

ئوو دڵەگەیٚ من، وە ناوەێن دەسەیل ت ــ

چۆ ماسی سۆەرە بۆچگڵانەێگ

ک لە قەپ قولاپ مەرگ

هەڵگەردیاۋدەو وە ئاوان ژیان.

## ❖ برگشت

برعکس گریه کن!

بگذار برای یکبار هم که شده

باران، به آسمان برگردد

ابر، به دریا

دریای متلاطم، به آرامش

آرامش، به قلب من

و قلب من، به میانِ دست‌های تو ــ

مانند یک ماهی قرمزِ کوچک

که از چنگِ قلّابِ مرگ

به آب‌های زندگی برگشته باشد.

### ❖ نزاکە

ئاهـ ئەڵکێشم...

دار ناژێک سەر چەمنێ

وە ژێر تریفەێ مانگ

### ❖ بی‌تابیِ کودکانه

آه می‌کشم...

صنوبری سر می‌خمانَد

به زیر نورِ ماه

## ❖ بچرٍەم

سەیر کە، شوونپاگان ژیان چۆ گوما هاتنە!

وەتومە پێد:

"هەنایٚ بیٚدەنگید

لە بان ناوەگەم، پەیەلٚپەیٚ وەفر وارێدن..."

## ❖ صدایم کُن

نگاه کُن، ردّپاهای زندگی چگونه ناپدید گشته‌اند!

گفته بودمات:

«وقتی سکوت می‌کنی

روی اسم‌ام، پیاپی برف می‌بارد...»

## ❖ ژیین د ناوجاێ بێدەنگی

تا هنا ئڵەیم نەکەری

د ژێر سان سەرد فەرامووشی

بێ کش و جم مینم.

لەفاو ڤڵات بگرێ د ڤەر،

هەر هشکەگڵاڵێکم

ڕێڤار ڕێ گومکردەێ

ک شێڤەێ ناوەکەێ نەێرێ دەێ!

## ❖ زیستن در مرکزِ سکوت

تا صدایم نزنی

زیرِ سنگِ سردِ فراموشی

ساکن و خاموش خواهم ماند.

سیلابه جهان را فرا بگیرد،

همچنان خُشک‌رودی خواهم بود

مسافری گم‌کرده راه

که دیگر، شباهتی با نامِ خودش ندارد!

## ❖ شێتانە

تا ئەڵسم

هرچە جەمسەرییەلەێ ناخم بووڵنن و

مەلیچکەلەێ پشت پەنجرەکە دتاڕنن.

م

ئەڵسەر لەتکە یەخ سەرگەردانێ

دەناون گەورەدەریاێ تەنیایی ژوورەکەم

دووسیامە

ها سەێل دیمەنێ کەرم

ک تا چەو بڕ کەرێ

تەنیا بەرف پەتییە و

دەێ هیچ...

ڕچکیامە

ڕچکیامە

تا کەپووڵ و گەردن و هناسەلم

ئۆ یە، تازە بنیاێ ڤەسەرهات دیرییەکەێ تنە!

## ❖ دیوانه‌وار

همین‌که بلند می‌شوم

خرس‌های قطبیِ درونم غرّش می‌کنند و

گنجشک‌های پشت پنجره را فراری می‌دهند.

من

روی یخپاره‌ای سرگردان

میانِ اقیانوسِ تنهاییِ اتاقم

ایستاده‌ام

دارم به منظره‌ای نگاه می‌کنم

که تا چشم کار می‌کند

تنها برفِ خالی‌ست

و دیگر هیچ...

یخ زده‌ام

یخ زده‌ام

تا سر و گردن و نَفَس‌هایم

و این، تازه سرآغازِ ماجرایِ دوریِ توست!

## ❖ کوتەهەڕ

دڵم گنێ زق بی

زەردەخەنەێ کردی و ئێمکە دەێ

هەم ئەڵ کەم کوتەهەڕێ!

## ❖ آتشِ افروخته

قلبم پارەیخی بود

لبخند زدی و حالا دیگر

کنارِ آتشِ افروختەام!

## ❖ چرێمنەت

لە بێدەنگی

ناوەگەت ژیلەمووێگە.

لەی تیەریکستان سەردوسڕە

وە ئەوینەو

ژە قوڕن دڵ

چرێمنەت

تا بڵووزە بکیشی:

ئازادی!

ئازادی!

ئازادی!

## ❖ صدایت می‌زنیم

در سکوت

نامات اخگری زیرِ خاکستر است.

در این تاریکستانِ زمهریر

با عشق

از ژرفنایِ دل

صدایت می‌زنیم

تا زبانه برکشی:

آزادی!

آزادی!

آزادی!

## ❖ خێیاڵ چا؟

خێیاڵ،

ماڵهاڵووبارکەرێکە

نیشتێیە ئەڵسەر بنجک گوڵێ

ک نییەسەیَ!

## ❖ خیال چیست؟

خیال،

کفشدوزکی‌ست

نشسته بر بوته‌ی گُلی

که نیست!

## ❖ زووان داڵگیی ئەوین، ئازادییە

ئاسمان

وە باڵنەیلەێ

ئاسمانە؛

تفەنگ وەرەو چریکەێ هەر پەلەوەرێگ بگری

کوتێ لە کەویی ئاسمان دشکێ.

زەمین

وە دارەیلەێ

زەمینە؛

تەور لە قەشەنگیی باڵاێ هەر دارێگ بوەشنی

یەکێگ لە هۆرەوەرییەگان شیرین زەمین، تێدە گوما.

ڕووبار

وە گێشت ماسییەگانێ

ڕووبارە؛

خەون هەر ماسی بۆچکەڵەێگ

وەناو تونگ شیشەیی، دیل و گرفتار بکەی

چوورێگ لە ئارزووە گەوراگەێ زەریابۆن وشکەو دبێ.

ئەوین

وه زووان داڵگیی خوەیٚ، "ئازادی"

وەگەرد ئیمەیا قسیە دکەیٚ؛

تەنانەت ئەگەر یەک پیت لە پیتەگان ئازادی کەمەو بکەی

ئەوین، زووانیٚ دچوو دە برٍ.

### ❖ زبان مادریِ عشق، آزادی‌ست

آسمان

با پرنده‌هایش

آسمان است؛

تفنگ را به سمت آوازِ هر پرنده‌ای بگیری

تکّه‌ای از آبیِ آسمان می‌شکند.

زمین

با درخت‌هایش

زمین است؛

تبر بر زیباییِ قامت هر درختی بزنی

یکی از خاطرات شیرینِ زمین، گم می‌شود.

رودخانه

با همه‌ی ماهیانش

رودخانه است؛

رؤیای هر ماهی کوچکی را

درون تُنگ شیشه‌ای، اسیر و دربند کنی

قطره‌ای از آرزویِ بزرگِ دریاشدن می‌خشکد.

عشق

با زبان مادریِ خودش، «آزادی»

با ما سخن می‌گوید؛

حتی اگر یک حرف را از حروفِ آزادی کم کنی

عشق، لُکنت زبان می‌گیرد.

## ❖ میلکان

چەشن سەوڵ

هەمۆشە سەوزە

زام میلکانم

## ❖ سرزمینِ اجدادی

سروآسا

همیشه سبز است

زخمِ میهن‌ام

## ❖ خوداژن ڕەنگینی

"چروو، خوداژن ڕەنگینێکە

ئەژ ئی ڤتە

زەمین سووزیایێە ئەڤرەسێ

نە قاقەز ئسپێ

ک یایێهووشێ

ئەژ دیرووک سەڤز دارسان

بڕینە.

## ❖ الهەی زیبایی

«الهەای زیباست، نهالِ نورسِ بلوط

این گفتە را

زمینِ سوختە می‌فهمد

نە کاغذِ سپید

کە حافظەاش را

از تاریخِ سبزِ جنگل

بُریدەاند.

## ❖ کڵکڵە

خەیلێگە واشنەت ئەڵنەکردگە

گیسەیل نیشتمانەگەم بریندارن، ئازادی!

## ❖ نگرانی

دیری‌ست نسیم‌ات نوزیده

گیسوانِ میهن‌ام زخمی‌ست، آزادی!

### ❖ دەی تاریکسانە، ڤیرم چریسکنێ

ئاخ چریسکیا

دە ئاسووەل دەسمەڕەس ــ

ئاسارە نە، یایێت!

### ❖ در این تیرگی‌ها، تیر می‌کشد ذهنم

آه درخشید

در افق‌های دور از دست ــ

ستاره نه، یادت!

## ❖ بەرد تیەریکی

دی جیاوازی نەێرێد

ک تووف تووف، واران بووارێد

یا بەرد تیەریکی!

گوڵبەرەفتاویٚ ک شەوەکیان

هەتاوەگەیٚ گوما کردۊد

پەژارەیٚ چاوانیٚ وەرەو هەر هنازیٚ گل بەێد

ئەوردا، دەسپێک وێرانییە.

## ❖ سنگِ تاریکی

دیگر فرقی ندارد

که بارانِ سیل‌آسا ببارد

یا سنگِ تاریکی!

گُل آفتابگردانی که بامدادان

آفتابِ خود را گم کرده باشد

اندوهِ چشمانش را به هر سمتی بچرخاند

آنجا، ابتدای ویرانی‌ست.

## ❖ سەفەرێگ وە هەراێهەری

"دڵووپە" ئاشناوە بی وەل کڵپەیٚ ئەوینا

بی وە کانی!

بی وە ڕووبار پڕ تافەتاف و وەگوڕ!

شەپوولاوی، چی و چی...

"وردیلە" هاودەنگەو بی وەرد ئەوینا

بی وە نۆرا!

پا تا وە سەر، بییە بەوش و تلیلی!

وە ئەڵپەڕین، چی و چی...

دڵووپەیٚ ک خوەیٚ ئاگر دا،

ڕەسی وە زەریا.

وردیلەیٚ ک دەناو ئەوین تاویا،

ڕەسی وە واتا.

بنووڕە پانتاییەگەیٚ سامدار زەریا!... دڵووپە ها کوو؟!

بنووڕە دیمەنە پڕ واتاگەیٚ گەردوون!... وردیلە ها کوو؟!

## ❖ سفری به جاودانگی

«قطره» با آتشِ عشق آشنا شد

چشمه شد!

رودِ خروشنده و سرزنده شد!

موج‌زنان، رفت و رفت...

«ذرّه» با عشق همنوا شد

نور شد!

پای تا سر، هلهله و شور شد!

رقص‌کُنان، رفت و رفت...

قطره‌ی آتش‌زده در خویش،

به دریا رسید.

ذرّه‌ی بُگداخته در عشق،

به معنا رسید.

وسعتِ پُر هیبتِ دریا ببین!... قطره کو؟!

جلوه‌ی پُر معنیِ کیهان ببین!... ذرّه کو؟!

## ❖ چەرخ چەپگەرد

ئاخ! چ ئازاردەر و گیانتەزنە:

هەرئەوانە وە "تیەریکی" تاوانبارت کەن

ک چەنە گۆهەسارەیگیش

ڕووژنا نەبۆەسە بەش دڵەیلێیان

ئوو وە چمەتەگەێ هەمۆشە هەڵگیرسیاێ گیان ت

ویشن "هەسارەێ مردگ!"

## ❖ روزگارِ ناسازگار

آه! چه تلخ و جان‌کاه است:

همانانی به «تاریکی» متهمات می‌گردانند

که به اندازه‌ی یک کِرم شبتاب نیز

دل‌هاشان نصیبی از روشنا نُبرده است

و مشعلِ همیشه افروخته‌ی جانِ تو را

«ستاره‌ی مُرده» می‌خوانند!

### ❖ دەسڵاتخوازی

چ مەیدان جەنگ گەورەیکە جەهان!

هەرچێ لڕ دێیارێمن،

گل نەیخوەرێمن!

### ❖ سلطه‌جویی

چه میدانِ جنگِ بزرگی‌ست جهان!

هرچه دَور می‌زنیم،

برنمی‌گردیم!

## ❖ کاولستان

جگێ مەنێیە تا

ئاو، بووە ویرەوەری

خاک، بووە ویرەوەری

هەوا، بووە ویرەوەری

هادەێ تەنیا ئاگر وە جی بمینێ

دە ژێر بیلەکوو سەرد.

لەناو گەنمجاڕەکەێ سزیاێ جەهان

وە قوتەێل داوڵەکەێ شڕپووش

گووش دەیمن

ئوو ئاسمان

نەتەنیا ژە پەپووسڵێمانی و واران

ک ژە کلبیین یەێ قڵاژیلەێ لاڵیش

چووڵ و پەتییە.

## ❖ خرابستان

کم مانده تا
آب، خاطره شود
خاک، خاطره شود
هوا، خاطره شود
شاید تنها آتش باقی بماند
زیر توده‌ی خاکسترهای سرد.
در گندمزارِ سوخته‌ی جهان
به سرفه‌های مترسکِ ژنده‌پوش
گوش می‌دهیم
و آسمان
نه‌تنها از هُدهُد و باران
که از عبور یک زاغِ لال هم
تهی‌ست.

## ❖ بپوورڕ و نەپوورڕ

خەون، گەردوون وەچاوناديار بێ‌پەرتەخێگە

یا هادەیش

گەردوون، خەون وەچاودیار بێ‌پەرتەخێگ بوو!

ئەمانگ هەرچێ هەس

لە نەۆین ترسێنەر "ئازادی"

نە خەون تۆەنێ گەردوونێگ بزاێ و

نە گەردوون، شوون و کاتێگ خەوناوییە.

وە بێ ئازادی

ئەڵسەنگانن "شانۆ ژین"، ئاو دە ویژنگ کردنە!

## ❖ ممکن و ناممکن

رؤیا، کیهانِ نامرئیِ بی‌انتهایی‌ست

یا شاید هم

کیهان، یک رؤیای مرئیِ بی‌انتها باشد!

اما هرچه هست

در فقدانِ هول‌انگیزِ «آزادی»

نه رؤیا می‌تواند کیهانی بزاید و

نه کیهان، مکان و زمانی رؤیایی‌ست.

بدون آزادی

نقدِ «تئاترِ زندگی»، آب را با غربال پیمودن است!

### ❖ لێژایی

ئاونگێ ڤە پەڕەیێ گوڵێ ڤت:

"بێبەزەی! نەسرەم ژە گووشەیێ دیدەت

مەگەر چەنێ ژیێ تکێ ئەسر؟!"

### ❖ نشیب

شبنمی به برگِ گُلی گفت:

«سنگدل! پاکم نکن از گوشه‌ی چشمات

یک قطره اشک مگر چقدر زندگی خواهد کرد؟!»

## ❖ لێڤە، جەهان جوورێ ترەک ڤینێ

چنەڤ چەڤەڕێیم

ک ئەڤ نەرمەڤەن دووسیایۊە ئەڵ ئاسوویش

ئەژ دیر، خوەتە!

## ❖ دیوانه، جهان را طور دیگری می‌بیند

چنان چشم‌انتظارم

که آن درختِ پسته‌ی کوهیِ ایستاده در افق هم

از دور، خودِ توست!

## ❖ پەڕە قاقەز چەرمگ

هەر لەتێگ ژە خوەم

لەناو نۆسمانێگ وە جی هیلم

وە وێنەیٚ ئەور ڕەشێگ

ک وشە وە وشە

وەگەرد وەفریٚ ک وارێدن

خوەیٚ ژە گەشتنامەیٚ دەلیا

سڕێدەو.

نۆسم

نۆسم

ئوو زانم ک ڕووژێگ وە بندرس ڕەسم

لە ئاسمانێگ سایٚ لرک

وە وێنەیٚ قاقەزێگ چەرمگ

ک وا

نۆسمانەیلەیٚ وەگەرد خوەێیا بردگە.

## ❖ صفحه کاغذ سفید

هر تکّه‌ی خود را

در نوشته‌ای جا می‌گذارم

مانند ابری سیاه

که کلمه به کلمه

همراه برفی که می‌بارد

خودش را از سفرنامه‌ی دریا

پاک می‌کند.

می‌نویسم

می‌نویسم

و می‌دانم که روزی به پایان خواهم رسید

در آسمانی صافِ صاف

مثل کاغذی سفید

که باد

نوشته‌هایش را با خود بُرده است.

## ❖ چووڵاچووڵ

هەر شوونێک نەڤووەت

پەژارەم ها ئووره

## ❖ متروکه

هر جا تو نباشی

اندوهِ من آن‌جاست

## ❖ وشەێلەم کرێکارن!

وشەێلەم

کارکەرەێل ڕەنجدەر و ڤەکارێکن

ک ئەژ گوڵ بەێان تا سەرئێڤارە

کار دکەرن و ئەرەخ دڕژنن

تا دیڤارەلێ ئەژ ئاێنەێ پەتی

دە ڤراوەر ڕەنگینییت ئەڵارن.

ئاونی، شەڤەل شەل و شەکەت دخەون و

خەو زەردەخەنەت دڤینن

شەڤەکی ک ئەڵسن و

ڤە دڵێ پڕ ئەژ همێ

دچنە سەر کار ڕووژانە

دڤینن گرد دیڤارەلەێ ڤە ئاێنە ئەڵڕازەنەێ دڤونە

ڕمیانە و

داڵ ئەژ نوو، ماڵ ئەژ نوو!

دووارە مێیا بنیا بنن...

## ❖ کلمات‌ام، کارگرند!

کلمات‌ام

کارگرانی سخت‌کوش و پُرتلاش‌اند

که از سپیده‌دم تا عصر

کار می‌کنند و عرق می‌ریزند

تا دیوارهایی از آینه‌ی خالص

در برابر زیبایی‌ات برآورند.

آن‌ها، شب‌ها خسته و کوفته می‌خوابند و

خواب لبخندت را می‌بینند

صبح که بیدار می‌شوند و

با دلی پُر از امید

به سرِ کارِ روزانه می‌روند

می‌بینند همه‌ی دیوارهای آینه‌کاری‌شده‌ی دیروز

فرو ریخته‌اند و

روز از نو، روزی از نو!

دوباره باید آغاز کنند...

### ❖ ئامووژیارانه

ـ پشت ئێ سەردەنە چە هەس؟

ـ یەێ جەهان "نازانم"

### ❖ حکمت‌آمیز

ـ پشت این قلّه چه هست؟

ـ یک دنیا «نمی‌دانم»

## ❖ داخین

ئەسپێ گرێڤێ
ئەژ سووارەکەێ تەنیا
چەن دڵووپە خین ئەڵ یاڵ

## ❖ داغدار

اسبی می‌گرید
از سوارش تنها
چند قطره خون بر یال

## ❖ لێخناو

بێدەنگ دووسی

نقمەڤ دووێ مۆنگ چواردە

دەناو گڵاڵ لێخن

## ❖ تیره آب

سکوت می‌کنی

غرق می‌شود ماهِ تمام

در رودِ گل‌آلود

## ❖ پەیام

هەزار هەزار کەپوو پایزان

وە دەس واوە هەڵوەدا و وەیلان؛

پەیامەگەیْ ت ها وە کامێیان؟!

## ❖ پیغام

هزار هزار قاصدکِ پاییزی

آواره و دربەدر در باد؛

پیغامِ تو با کدامین است؟!

### ❖ پاتشایۆ بێجنک

کڵکڵەبایۆ سەرداوە...

نە کڵاو مەن و نە پرتاڵ شڕە

"داووڵ" مەتەڵ درووییینێک بی؟!

### ❖ پادشاهِ بی‌لباس

گردبادِ پاییزی...

نه کلاه ماند و نه رختِ پاره

«مترسک» افسانه بود؟!

## ❖ ئاگرەوارەبۆن

هەر ژە هاتنێ دیار بی

ک ئەوینە؛

ژە ئاگرێ ک وە گیان ئاو خس

## ❖ سرآسیمگی

از همان آمدنش پیدا بود

که عشق است؛

از آتشی که به جانِ آب انداخت

## ❖ ژاری

هۆر وە "هۆچ" ئەکەم

وە "خوەم دە بێ تنی"

## ❖ فقر

به «هیچ» می‌اندیشم

به «خودم در بی تویی»

## ❖ سەنگەلا

دیر ک دووم

تو نەێڤینم

نزیک ک دووم

خوەم!

ڤەی ژۆنە

ژیان، تاهەیٚ سەنگەلاو.

## ❖ نامیزان

دور که می‌شوم

تو را نمی‌بینم

نزدیک که می‌شوم

خودم را!

با این رنج

زندگانی، تا ابد بارَش کج است.

## ❖ سەراوەنۆن

ـ نوقم کام دەریای؟!

ـ نەبۆن ئەۆ

## ❖ گم‌گشته

ـ غرقِ کدام دریایی؟!

ـ غیابِ او

## ❖ نەرمەخوناو

ڤتم ئێس تنی...

تمەرز نەرمەڤاران بی و ددا

ئەڵ پەنجرە

## ❖ نرم‌بار

با خودم گفتم تویی...

نگو که نم‌نمِ باران بود و می‌زد

بر پنجره

## ❖ ئەژ ڤیر خوەم چیمە

چنەڤ دە گلاڵەکەیٚ بیٚپەیٚ دیرییت

نوقمم

ک دەیٚ دەسمێیەت هۆچ کەسیٚ نەیٚتۆنیٚ

م ڤە ڤیر من بێیاریٚ.

ئەژ ڤیر خوەم چیمە

ئچەڤە ک خرەبەردیٚ ئگەرد گلاڵ چۆیی

یا بەڵگ زەردیٚ ئگەرد بایٚ.

هنا ئڵەت کەرم

هنا ئڵەت کەرم

تا ڤە هانایٚ "نەڤیین"ـەلم برەسی!

## ❖ از یادِ خودم رفته‌ام

چنان در رودخانه‌ی ژرفِ دوری‌ات

غرقم

که دیگر دستِ یاریِ هیچ کسی نمی‌تواند

مرا به یادِ من بیاورد.

از یادِ خودم رفته‌ام

آن‌گونه که قلوه‌سنگی با رود رفته باشد

یا برگِ زردی با باد.

صدایت می‌زنم

صدایت می‌زنم

تا به دادِ «نبودن»هایم برسی!

## ❖ دار بەێچەڵ

چی گوارییِن مۆنگ

ئەژ تەریکیی بێبن دارسۆن

ئەژ م گوار...

ئەژ م گوار...

ئەژ م...

پەڕ جۆمەکەێ دڕت

گیر کردێیە ئەڵ

پەل دارە بەێچەڵەکەێ هەڵقەسم؛

بمین!

## ❖ درختِ بازیگوش

همچون عبورِ ماه

از تاریکیِ عمیقِ جنگل

از من عبور...

از من عبور...

از من...

گوشه‌ی پیراهنِ بلندت

به شاخه‌ی درختِ بازیگوشِ شعرم

گیر کرده است؛

بمان!

## ❖ یهه‌تم تا بچم!

ـ چه که‌ری ڕێڤاره‌که؟

ـ ڤچۆنێ دم، ده‌ناون دۆ نه‌ڤیین

## ❖ آمدم تا بروم!

ـ رهگذر چه می‌کنی؟

ـ توقّفی کوتاه، میانِ دو نبودن

